له بڵاوکراوەکانی دەزگای نوری حیکمە بۆ پەروەردە و ڕۆشنبیری - ژمارە (٧٢)

# کانیاوی ڕەوان

## بۆ فێربوونی جوان خوێندنەوەی قورئان

### ئاستی یەکەم

نووسینی
توفيق صديق حمد



١٤٤٣هـ - ٢٠٢٢م

# کانیاوی ڕەوان

## بۆ فێربوونی جوان خوێندنەوەی قورئان

## ئاستی یەکەم




نووسین و ئامادەکردنی

**توفیق صدیق حمد**

چاپی یەکەم

١٤٤٣ هـ - ٢٠٢٢ م

# ناسنامەی کتێب


| | |
|---|---|
| ناوی کتێب: | کانیاوی ڕەوان بۆ فێربوونی جوان خوێندنەوەی قورئان<br>ئاستی یەکەم |
| بابەتی کتێب: | تەجوید |
| نووسین و ئامادەکردنی: | توفیق صدیق حمد |
| دیزاین: | محمد هاشم محمد |
| تایپ: | هێمن بورهان |
| قەبارە: | ١٧سم x ٢٤سم |
| ژمارەی لاپەڕە: | ٩٨ لاپەڕە |
| ساڵی چاپ : | ١٤٤٣هـ - ٢٠٢٢م |
| نۆرەی چاپ: | چاپی یەکەم |
| تیراژ: | (٥٠٠٠) دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٥٥٤)ی ساڵی (٢٠٢٢)ی پێدراوە.






لە بڵاوکراوەکانی (دەزگای نوری حیکمە بۆ پەروەردە و ڕۆشنبیری) - ژمارە (٧٢)





بڕیار
القرار
2008
دەزگای بڕیار بۆ چاپ و پەخش و بڵاوکردنەوە
مؤسسة بريار للطباعة والنشر والتوزيع
07504052790-07504463230

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا﴾

المزمل: ٤

## (دەوری قورئان بکەرەوە بە وردی و لەسەرخۆ)



قال رسول الله (ﷺ):

## ((خَيرُكُم مَنْ تَعلَّمَ القُرآنَ وَعلَّمَهُ))

رواه البخاري

واتە: چاکترین و باشترینتان ئەو کەسانەن کە قورئان فێر دەبن و خەڵکانی تریش فێردەکەن.



# پێشەکی سەرۆکی دەزگا

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على خاتم الأنبياء والمرسلين وعلى آله وصحبه ومن دعا بدعوته واهتدى بهديه إلى يوم الدين...

ئێمەی موسڵمان باوەڕمان وایە قورئانی پیرۆز کە فەرمودەی (الله تعالى)یە دابەزاندوە بۆ سەر گیانی پێغەمبەرەکەی محمد (ﷺ) ئەویش بەوپەڕی ئەمانەتەوە گەیاندوویەتی بە هاوەڵان (رضي الله عنهم أجمعين)، ئیتر لە ئەوانیشەوە نەوە لە دوای نەوە تاوەکو گەیشتووە بە ئێمە لە دوای زیاتر لە (١٤٤٣) ساڵ بە هەموو وردەکاریەکانییەوە وەکو ئەو رۆژەی کە تیایدا دابەزیووە، ئەوەش خۆی لە خۆیدا سەلمێنەری ئەو ئایەتەی ژمارە (٩)ی سورەتی (الحجر)ـە کە دەفەرموێ:

﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ واتە: بەڕاستی ئێمە خۆمان ئەو قورئانەمان ناردۆتە خوارێ و هەر خۆیشمانین دەیپارێزین.

دەبێت بزانین ئەرکی سەرشانی ئێمەی موسڵمان بەرامبەر بە قورئانی پیرۆز بریتییە لە :

١- جوان خوێندنەوەی هەر وەکو دابەزیوە.

٢- تێگەیشتنی واتاکانی.

٣- کارپێکردنی.

بۆ ئەوەی فێربین قورئانی پیرۆز بە راست و دروستی بخوێنینەوە پێویستە شارەزای یاساکانی (تجويد) بین ئینجا لە خزمەت مامۆستایەکی شارەزا لەو بوارەدا بە شێوەی کرداری (عملي) یاساکان جێبەجێ بکەین و وەریبگرین.

بێگومان سەرچاوەی ئەو زانستەش وەکو باقی بوارەکانی تری زانستە شەرعییەکان بە زمانی عەرەبین، بەداخەوە زۆربەی هەرە زۆری نەوەکانی ئەو سەردەمە لە زمانی عەرەبی (کە زمانی قورئانە) ناشارەزان، بۆیە بە پێویستمانزانی داوا لە بەڕێز (توفيق صديق) بکەین کە بە فەزڵی (الله تعالى) شارەزایە لەو بوارە بە زمانی شیرینی کوردی مەنهەجێکی (تجويد) بۆ نەوجەوانان بنووسێت تاوەکو ئێمە وەکو (دەزگای نوری حیکمە) سوودی لێ وەرگرین وە هەروەها بۆ هەر کەسێك و دەزگا و بنکەیەك کە لە خزمەتی قورئانی پیرۆزدایە ببێتە سەرچاوە، هەروەها کتێبخانەی کوردیشی پێ دەوڵەمەندتر بێت، ئەویش بە سوپاسەوە هەستا بە نووسینی ئەو کتێبە بە ناونیشانی (کانیاوی ڕەوان بۆ فێربوونی جوان خوێندنەوەی قورئان) کە لە سێ ئاست پێك هاتووە، داوا لە (الله تعالى) دەکەین بەرەکەت بخاتە عیلم و عەمەل و تەمەنیەوە و بە چاکترین شێوە لێی قبوڵ بکات.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.




**د.عبدالله حداد**

سەرۆکی دەزگا

١٧ی ربیع الأول ١٤٤٣ کۆچی

٢٠٢١/١٠/٢٣ میلادی

# پێشەکی بەڕێز (م. دلێر گەرمیانی)

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه أجمعين.

پاش ستایشی بێ پایان بۆ خوای گه وره و زانا و دانا، سوپاسی دەکەم بۆ ئەوەی فەزڵی لەگەڵدا کردم نیوەی بەرگی یەکەم و دووەم و سێیەمی ئەم کتێبەم لەبەر دەستایە لە (المسجد الحرام) پێداچوومەوە بە وردی، خودای گەورە پاداشتی نووسەر بداتەوە کە ئەوەی من خوێندمەوە ماندوبوونێکی بەرچاوی پێوە دیارە، زۆر بە تێری و وردی رەچاوی قۆناغەکانی کردووە، زۆر بە کەمی تێبینیم لەسەر هەبووە، هەندێ لە تێبینییەکان تەنها ئەوەبوو کە بابەتی زۆر کەم پە یوە ست بوو بە قیرائاتەوە نەك بە ریوایەتی (حفص)ـە وە، واتە نووسەر بۆ زیاد دەوڵەمەندبوونی نووسینەکە هێنابووی ئەگەر نا (صحیح) راست بوو.

بۆیە داواکارم لە خوای گەورە پاداشتی بە خێری بداتەوە بۆ ئەو خزمەتەی کە کردوویەتی (إن شاءالله)، مامۆستایان و قوتابییانی زانستی (تجوید) و زانستی جوان خویندنەوەی قورئانی پیرۆز سوودمەند دەبن لەم بەرهەمە و دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی لە بابەتی جوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز.

لە کۆتایشدا دەڵێم؛ کەمال و تەواو تەنها بۆ خودای گەورەیە، خودای گەورە پاداشتی نووسەر بداتەوە کە ئەوەی پەیوەستە بە زانستی (تجويد)ەوە لە ریوایەتی (حفص) بە جوانی و بە تێر و تە واوی لەگەڵ رەچاوکردنی هەموو قوناغەکانی هێناویەتی و سوپاس بۆ خودای گەورە.

وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين

دلێر أحمد محمد گە رمیانی

المسجد الحرام

رۆژی دووشه ممه

٢٣/ جەمادی یەکەم/ ١٤٤٣ کۆچی

٢٠٢١/١٢/٢٧ میلادی

پاش نوێژی عه سر



# پێشەکی نووسەر

الْحَمْدُلله رَبِّ العَالَمِين وَصَلَّى اللهُ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين أَما بَعْد:

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ پەروەردگاری جیهانیان، کە ڕێنوێنی کردووین بۆ خزمەتکردنی قورئانی پیرۆز و هەڵگرانی ئەو ئەمانەتە گەورەیە لە نێو دڵ و دەروونیاندا.

ئەگەر سەیری کوردستان بەگشتی بکەین ئەوا ژمارەیەکی بەرچاو لە گەنجان و نەوجەوان و منداڵان لە هەردوو ڕەگەزی کوڕان و کچان دەبینین کە روویان لە ناوەندەکانی فێرکردن و لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز کردووە.

(دەزگای نوری حیکمە بۆ پەروەردە و ڕۆشنبیری) یەکێکە لەو ناوەندە ناوازانەی کە هەر لەسەرەتاوە سەنگ و پێگەی تایبەتی خۆی هەبووە لەسەرجەم شار و شارۆچکەکانی هەرێمی کوردستان بۆ بڵاوکردنەوەی زانستەکانی قورئان و ڕۆشنبیری ئیسلامیی و بەهای بەرز و ئاکاری جوانی موسڵمانانە، خاوەن پڕۆگرامێکی تایبەت بووە بۆ سەرجەم ئاستەکانی بەشداربووانی دەزگاکە.

لێرەدا جێی خۆیەتی سوپاسی سەرۆکی دەزگا و برایانی ئەنجومەنی باڵای (دەزگای نوری حیکمە) بکەم کە متمانەیان بە من بەخشی بە مەبەستی نووسین و ئامادەکردنی چەند پەرتوکێکی شیاو لەزانستی (تجوید) بە پلە بەندی بە شێوەیەك گونجاو بێت بۆ قۆناغی نەوجەوانان.

ئێمەش لەم قۆناغەدا بەپێی توانا هەوڵماندادوە بەشێوازێکی ئاسان و سادە ئەو ڕێسایانەی گونجاو و شیاون لە سەرەتادا بخوێندرێن وەك: (حوکمی لامی ناساندن و نونی (ساکن) و (تنوین) میمی (ساکن) و... هتد) ئامادەمان کردووە و خستومانە بەردەستی زانستخوازانی خۆشەویست، ئەویش لە ڕێگەی دانانی وێنە و چالاکی و ڕاهێنان بۆ ئەوەی بەکردار فێری زانستی (تجوید) ببن.

ئامانجمان له ئـامادەكردنی ئەم سێ پەرتووكـەدا بۆ قـۆناغەكــانی (نەوجەوانان) بریتین له:

١- بەدەست هێنانی ڕەزامەندی لەلایەن بەدیـهـێنـەری ئـاسـمـان و زەوی.

٢- پـاراستنی زمـانی فـێرخوازان له هەر هـەڵەیەك له كـاتی خوێندنەوەی قورئاندا.

٣- سوود گەیاندن به فـێرخـوازان و هەڵگرانی قورئان بۆ ئەوەی زیــاتر شارەزای ڕەوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بن و، ببن به هاوەڵی قورئان.

٤- وشیار كردنەوەی هەموو تاكێك بەشێوەیەكی كرداری كه فێرخواز بەبێ بوونی مامۆستا ناتوانێت به جوانی فێری قورئان خوێندن بێت، چونكه زانستی ڕەوان خوێندنەوەی قورئان له هەموو زانستەكانی تر جیایه، بۆیه فێربوونی ئەم زانسته پێویستی به مامۆستای شارەزا و لێزان هەیه.

٥- دەوڵەمەندكردنی كتێبخانەی كوردی بۆ نەوجەوانان به زمانی شیرینی دایك.

له كۆتاییدا داواكارین له خوای پەروەردگار ئەم كارەمان لێ قبوڵ بكات و بیكات به توێشوو له ڕۆژێكا كەهیچ شتێك فریای ئادەمیزاد ناكەوێت كاره باشەكانی نەبێت.

اللهُم اجْعَلْ عَمَلِي كُلَّهُ صَالِحًا ... وَاجْعَلْهُ لِوَجْهِكَ خَالِصًا ... وَلَا تَجْعَلْ لِأَحَدٍ فِيهِ شَيئًا ... اللهم آمين.

توفيق صديق حمد

٣ رمضان ١٤٤١ هـ

٢٠٢٠/٤/٢٦ م

# پلە و پایەی قورئان خوێن [١]

١- قورئان خوێن چاکترینی نێو خەڵکین: وەك: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((خَيرُكُم مَنْ تَعلَّمَ القُرآنَ وَعلَّمَهُ)) رواه البخاري. واتە: چاکترین و باشترینتان ئەو کەسانەن کە قورئان فێر دەبن و خەڵکانی تریش فێر دەکەن.

٢- کەسە نزیك و تایبەتەکانی خوای گەورەن لە نێو خەڵکیدا: وەك: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((إِنَّ لله أَهْلِينَ مِنَ النَّاسِ)) قَالُوا: يارَسُولَ اللهِ، مَنْ هُم؟ قَالَ: ((هُم أَهْلُ القُرآنِ، أَهْلُ اللهِ وَخَاصَّتُهُ)) صَحَحَهُ الألباني في صحيح ( ابن ماجة ).

واتە: (بێگومان پەروەردگار لە نێو خەڵکیدا کەسانی تایبەت و نزیکی هەیە)، هاوەڵان فەرموویان: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟ فەرمووی: ئەوانە دۆستی قورئانن و کاریان پێکردووە، دۆستانی قورئانیش هەڵبژێردراوی پەروەردگارن.

٣- قورئان دەبێت بە تکاکار بۆ هاوەڵی خۆی لە ڕۆژی دواییدا: وەك: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((اقْرَءُوا القُرآنَ فإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ القِيَامَةِ شَفِيْعاً لأَصْحابِهِ)) رواه مسلم.

واتە: قورئان بخوێنن چونکە لە ڕۆژی دواییدا دەبێتە تکاکار بۆ هاوڕێیانی.

---

(١) دەبێ ئەو مەرجانەیان لێ بێتە جێ، ئینجا دەگەن بەو پلەو پایەیە:
١- خوێنەری قورئان نیاز و مەبەستی تەنها گەیشتن بەڕەزامەندی پەروەردگار بێت.
٢- کارکردن بەفەرمایشتی خوای کار بەجێ .
٣- تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی قورئان و پاراستنی لە لاپەڕەی سینەیاندا.

٤- پلەو پایەیان بەرزە لە دوارۆژدا: وەك: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:
((يُقالُ لِصَاحِبِ القُرآن : اقْرَأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ في الدُّنْيا، فإِنَّ مَنْزِلَتكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُها)) أخرجه أبو داود .

واتە :دەگوترێت بە هاوەڵی قورئان (لەکاتی چوونە بەهەشتدا) قورئان بخوێنە و بەرز بەوە وەك چۆن لە دونیادا دەتخوێند، بەڕاستی جێگەی تۆ لە بەهەشتدا لەگەڵ کۆتایی ئەو ئایەتانەیە کە ئەی خوێنی.



وانەی دووەم

# ئادابەکانی قورئان خوێندن

پێویستە لەکاتی قورئان خوێندندا ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕەچاو بکەین:

١- لاشە و دڵمان پاك بێت و نیاز و مەبەستمان تەنها گەیشتن بە ڕەزامەندی خوای گەورە بێت. وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ التوبة:٧٢.

واتە: ڕەزامەندی خوای پەروەردگار لە هەموو نازو نیعمەتەکانی بەهەشت بە نرختر و گەورەترە.

٢- پێویستە دەستنوێژ شوشتن پێش خوێندنی قورئان بێت، ئەمەش ڕای هەر چوار پێشەواکەیە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت:

أ- خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَّا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ﴾ الواقعة: ٧٩.

واتە: کەس دەستی لێنادات تەنها پاکەکان نەبێت.

ب- عَنْ عَمْرو بن حزم: ((أَلَّا يَـمَسَّ القُرْآنَ إلَّا طَاهِرٌ)) أخرجه الطبراني والبيهقي.

واتە: لە عەمری کوڕی حەزمەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەوەی پاك نەبێت دەست لە قورئان نەدا.

٣- سوننەتە سیواك بکرێت پێش خوێندنی قورئان.

٤- پێویستە شوێن و جل و بەرگ پاك وخاوێن بێت لە کاتی قورئان خوێندندا.

٥- خوێندنی قورئان بە دڵ ئارامی و بە خشوع بێت.

٦- گوتنی (أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ)، وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ النحل: ٩٨.

واتە: (كاتێك قورئانت خوێند و دەورت كردەوە، ئەوا پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی نەفرین لێكراو).

٧- گوتنی ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ لە سەرەتای هەموو سورەتەكان، تەنها لە سەرەتای سورەتی (التوبة) نەبێ.

٨- پێویستە لەسەر خوێنەری قورئان بەگوێرەی توانا بە تەرتیل و دەنگێكی خۆش و جوان قورئان بخوێنێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا﴾ المزمل:٤.

واتە: دەوری قورئان بكەرەوە بە وردی و لەسەرخۆ، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ((زَيِّنُوا القُرآنَ بِأصواتِكُم)) رواه ابن حبان وذكره الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة (٢ / ٢٧٠) واتە: قورئان برازێننەوە بە دەنگەكانتان.

٩- پێویستە لەسەر گوێگران بە ملكەچییەوە گوێی بۆ بگرن و خۆیان سەرقاڵ نەكەن. وەك خوای گەورە و مەزن دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلۡقُرۡءَانُ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴾ الأعراف: ٢٠٤.

واتە: كاتێكیش كە قورئان دەخوێندرێت، ئەوە گوێی بۆ بگرن و دڵی بدەنێ و بێ دەنگ بن، بۆ ئەوەی ئێوە رەحمتان پێ بكرێت و پەروەردگار بەزەیی پێتاندا بێتەوە.

١٠- پێویستە لەسەر خوێنەر و قوتابی قورئان شوێنی دانیشتنی تیلاوەی قورئان فراوان بكەن لە كاتی زۆربوونی بەشداربووان.

١١- لەسەر خوێنەری قورئانە دوای تەواو بوونی لە شوێنێكی شیاو (مصحف)ەكەی هەڵبگرێ.

# راهێنان و چالاکی

پ١/ ئەم وێنانە رەنگ بکە، پاشان هێمای ( ✓ ) بەرامبەر کرداری دروست و هێمای ( ✗ ) بەرامبەر کرداری نادروست دابنێ:






## پ٢/ ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕ بکەوە:

١- پێویستە دڵمان ............................ تەنها گەیشتن بەڕەزامەندی خوای گەورەبێت.

٢- پێویستە .................................. پێش خوێندنی قورئان بێت.

٣- پێویستە لەسەر گوێگران .................................. خۆیان سەرقاڵ نەکەن.

٤- پێویستە پاك و خاوێنی .................................. لە کاتی قورئان خوێندندا.

٥- پێویستە.................................. فراوانکردنی شوێنی دانیشتنی تیلاوەی قورئان

..................................................................

٦- پێویستە لەسەر خوێنەری قورئان دوای تەواو بوونی لە .................................. هەڵبگرێ.



## وانەی سێیەم

# چەند بنەمایەکی زانستی (تجوید)

### یەکەم: پێناسەی تجوید (التعریف):

**لە زمانەوانیدا:** واتە: جوان کردن (التحسین).

**لە زاراوەدا:** زانستێکە مەبەست تێیدا هەموو پیتێك ماف[1] و ئەوەی شیاوە بۆی[2] لە چۆنیەتی دەرچوون و سیفەتی پیتەکان و وەستان و دەست پێ کردن وەردەگرێت، بە بێ زۆر لەخۆکردن و کەمتەرخەمی لەسەر خوێندنەوەکەدا، بەو شێوە دروستەی کە هاوەڵان لە پێغەمبەر (ﷺ) وەریان گرتووە.

**دووەم: بابەتی زانستی تجوید (المَوْضُوعُ):** بریتیە لە وشە پیرۆزەکانی قورئانی پیرۆز.

### سێیەم: بەرووبومی زانستی تجوید (الثَّمَرَة):

بریتیە لە پاراستنی زمان لە هەر هەڵەیەك لە کاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا بە ئومێدی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە.

---

(١) ماف (حَقُّهُ): بریتیـە لە پێدانی مافی هەموو پیتێـك و دەرچوونی لە شوێـنی خۆی، وە پێدانی سیفەتـە بنەڕەتی یـەکـان کـە لـە پیتـەکە جیـا نابێتەوە، وەك: (الهمس، الجهر).

(٢) ئەوەی شیاوە بۆی (مُسْتَحَقُّهُ): بریتیـە لە پێدانی ئەو سیفەتانەی کە تووشی دێت (عارضة) وەك: (التفخیم، الترقیق، الإدغام، المـدّ، السُّکون، السَّکت).

### چوارەم: نرخ و بەهاکەی (فَضْلُهُ):

زانستی (تجويد) بەنرخترین و بەرزترین زانستە، چونکە پەیوەستە بە فەرموودەی خوای گەورە کە قورئانی پیرۆزە.

### پێنجەم: نـــاو (الاسمُ):

ناوی زانستی (تجويد)ـە، هەندێکی تر ناوی دەبەن بە هونەری خوێندنەوە (فَنُّ الترَّتِيل) و هەندێکی تر ناوی دەبەن بە مافی خوێندنەوە (حَقُّ التِّلاوة).

### شەشەم: حوکمی شەرعی:

بڕیاری شەرع دەربارەی ئەم زانستە دەکرێتە دوو بەش:-

### بەشی یەکەم: تەجویدی بیرەکی (نظري):

ناسین و دەرخکردن و تێگەیشتنی یاساو بنەماکانی زانستی جوان خوێندنەوە (تجويد) ئەرکی گشتی یە (فرض الكفاية).



## بەشی دووەم: تەجویدی کردەیی (عملي):

جێبەجێ کردنی بنەما (تجوید)ـی و بیرەکییەکان بە کردار لە کاتی قورئان خوێندندا بەگوێرەی توانا خۆی لێ شارەزا بکات و پەیڕەوی لێ بکات ئەرکی تایبەتە (فرض العين).

تێبینی:

- فرض الكفاية: کۆمەڵێك لە موسڵمانان کە بەس بن بۆ فێرکردنی باقی موسڵمانان ئەنجامی بدەن لەسەر ئەوانی تر هەڵدەستێ.
- فرض العين: دەبێ هەموو موسڵمانێک بیکات نێر بێ یان مێ.



## بەڵگەكانی واجب بوونی جوان خوێندنەوە (تجويد)

• لە قورئانی پیرۆزدا:

خودای باڵادەست دەفەرموێت: ﴿وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا﴾ المزمل:٤.

واتە: دەوری قورئان بكەرەوە بە وردی و لەسەرخۆ. وەك چۆن هاوەڵە بەڕێزەكان ڕەزای خوایان لێ بێت لە دەمی پیرۆزی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بە شێوازێكی ڕەوان وەریان گرتووە.

• لە سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ):

((سُئِلَ أَنَسٌ: كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ - (ﷺ) -؟. فَقَالَ: كَانَتْ مَدًّا. ثُمَّ قَرَأَ: {بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ} يَمُدُّ بِبِسْمِ اللهِ، وَيَمُدُّ بِالرَّحْمَنِ، وَيَمُدُّ بِالرَّحِيمِ.)) رواه البخاري

پرسیاركرا لە (أنس) خوا لێی ڕازی بێت لە بارەی چۆنیەتی قورئان خوێندنی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەویش فەرمووی: قورئان خوێندنی ئەو درێژكردنەوە (مدّ)ـی تێدا بوو، ڕەچاوی یاساكانی دەكرد، ئینجا (أنس) بۆ نموونە: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ـی خوێند بە درێژكردنەوە، پاشان فەرمووی، ئاوا لامی وشەی (اللّه) و ئەلیفی وشەی (الرحمن) و یای وشەی (الرحيم)ـی درێژكردەوە.

• لە كۆ دەنگی زانایاندا:

زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی واجبە قورئان بە شێوازێكی ڕاست و ڕەوان بخوێندرێتەوە و دووربێت لە لادان و كەم و كوڕی، وەك گۆڕینی پیت و سەرە (فتحة) و ژێرە (كسرة) و بۆرە (ضمة).

# راهێنان و چالاكی

## پ١/ ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕبكەرەوە:

١- بابەتی زانستی تەجوید (المَوْضُوعُ): بـریـتـیـە لـە وشــــە

.................................................................................................

٢- بـەرووبـوومی زانسـتی تـەجـویـد (الثَّمَرَة): بـریـتـیـە لـە ...................................... لە هەر هەڵەیەك لە كاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا بە ئومێدی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە.

٣- نــرخ و بەهاكەی (فَضْلُهُ): زانســتی (تجویــد) بەنرخترین و بەرزترین زانستە، چونكە پەیوەستە ........................................ ...................................................كە قورئانی پیرۆزە.



**پ٢/ هێمای ( ✔ ) بەرامبەر دەستەواژەی دروست و هێمای ( ✖ ) بەرامبەر دەستەواژەی نادروست دابنێ:**

١- ناسین و دەرخکردن و تێگەیشتنی یاساو بنەماکانی زانستی جوان خوێندنەوە (تجوید) ئەرکی تایبەتە (فرض العین). ◯

٢- جێبەجێ کردنی بنەما (تجوید)ـی و بیرەکییەکان، لە کاتی قورئان خوێندندا بەگوێرەی توانا خۆی لێ شارەزا بکات و پەیرەوی لێ بکات ئەرکی تایبەتە (فرض العین). ◯

٣- زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی واجبە قورئان بە شێوازێکی ڕاست و ڕەوان بخوێندرێتەوە و دووربێت لە لادان و کەم و کوڕی وەك گۆڕینی پیت و سەرە (فتحة) و ژێرە (کسرة) و بۆرە (ضمة). ◯



وانەی چوارەم

# خۆ پەنادان و ناوی خودا هێنان

١- خۆ پەنادان یان (الاستعاذة)[1] ئەوەیە بڵێی: ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ کاتێك خوێنەر ویستی دەست بەخوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بکات، جا چ لەسەرەتای سورەتدا یان لە ناوەڕاستی سورەتەکەدا دەبێت (الاستعاذة)[2] بکات. ئەوەش لەبەر فەرمانی خوای بەرزو باڵا، کە دەفەرموێ:

﴿فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ النحل:٩٨.

واتە: (کاتێك قورئانت خوێند و دەورت کردەوە، ئەوا پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی نەفرین لێکراو).

ئەگەر خوێندنەوەکەش لە وانەیەکی بازنەییدا بێت ئەوا یەکەم کەس کە بە دەنگ (الاستعاذة) دەخوێنێ و ئەوانی تریش بەبێ دەنگ دەیخوێنن. ئەوە لە کاتێکدا خوێندنەوەکە نەپچڕێت بە قسەی بەدەر لە وانەی قورئان، ئەگەر پچڕا ئەوا خوێنەر (الاستعاذة) دووبارەی دەکاتەوە.

---

(١) (الاستعاذة) کورتکراوەی ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ ـە.

(٢) رای زۆربەی زانایان ئەوەیە کە گوتنی (الاستعاذة) سوننەتێکی دووپاتکراوەیە.

## سوودەکانی دەنگ هەڵبڕین بە خۆپەنادان (الاستعاذة)

١- بەدیار خستنی دەستپێکردنی قورئان خوێنە.
٢- ئامادە بوونی دڵی کەسی قورئان خوێنە.
٣- بێ دەنگکردنی گوێبیستە.
٤- دەرکردنی وەسوەسە و خەتەرەی شەیتان و هەستی خراپە لە دەرووندا.

٢- ناوی خودا هێنان (البسملة)[1] کردن ئەوەیە بڵێی ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ پێویستە لە سەرەتای هەموو سوڕەتێکدا بوترێ جگە لە سەرەتای سوڕەتی (التوبة)، بەڵام لەکاتی دەست پێکردن لە ناوەڕاستی سوڕەتێکدا قورئانخوێن سەرپشکە لە خوێندنی ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ یا نەخوێندنی.



(١) (البسملة) کورتکراوەی ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ە.

# پیتەکانی پووك

**پیتەکانی پووك[1] بریتیە لە (ظا، ذال، ثا) ئەو پیتانە دەردەچێت لە پێشەوەی زمان لەگەڵ تیغی بڕەری دوانەی سەرەوە، لە دەرئەنجامی بەرکەوتنی ئەو دوو ئەندامە دەنگ دەردەچێ.**



دەرچەی پیتی (ظـا)



دەرچەی پیتی (ذال ، ثـا)



(١) تَخْرجُ مِنْ طَرَفِ اللِّسانِ مَعَ أطرافِ الثَّنَايَا العُلْيَا.

## ئاگـــاداری!

وریابە لە دەرنەچوونی پیتەکانی پووك (ظا، ذال، ثا) جگە لە شوێنی خۆی، لەبەر ئەوەی دەگۆڕێ بۆ پیتێکی تر، وەك ئەمانەی خوارەوە:

﴿مَذۡمُومٗ﴾

خوێندنەوەی بەهەڵە: بە گۆڕینی پیتی (ذال) بە (زا)

مَزمُومٗ

﴿فَكَثَّرَكُمۡ﴾

خوێندنەوەی بەهەڵە: بە گۆڕینی پیتی (ثا) بە (سین)

فكَسَّرَكُمْ

﴿ٱلظَّٰلِمِينَ﴾

خوێندنەوەی بەهەڵە: بە گۆڕینی پیتی (ظا) بە (زا)

الزَّالِمِينَ

تێبینی/ هەموو ئەم هەڵانە بە هیچ شێوەیەك ڕێگەپێدراو نیە.

وانەی شەشەم

# لامی ناسـاندن (لَامُ التَّعريف)

## ١- لامی قەمەری (اللَّامُ القَمَرِيَّة):

لامی قەمەری ئاشکرا دەکرێت وَ دەخوێندرێتەوە، ئەگەر هاتوو لە پێش ئەم چواردە (١٤) پیتە هات:

( اِبْغِ حَجَّكَ وَخَفْ عَقِيمَهُ )

**واتە:** بەرەو حەج کردنت برۆ، هەروا بترسە لەوەی حەجکردنت بێ ئەنجام بێت.

### سـوود

وریابە لەسەر جوان دەربڕینی پیتی لامی ناساندن، ئەگەر هاتوو پیتی(جیم)ی بەدوایدا هات، چونکە زۆرکەس هەڵەی تێدا دەکەن و دەری نابڕن.

نموونە:

﴿ٱلْجُمُعَةِ﴾ ﴿ٱلْجِبَالَ﴾

﴿ٱلْجَوَارِ﴾ ﴿ٱلْجَنَّةَ﴾

## نموونەی لامی قەمەری (اللَّامُ القَمَرِيَّة):

| نموونەکان | پیتەکان |
| --- | --- |
| ﴿ٱلۡأَرۡضِ﴾ البقرة: ١١ | أ |
| ﴿ٱلۡبَٰطِلَ﴾ الأنفال: ٨ | ب |
| ﴿ٱلۡغَفُورُ﴾ سبأ: ٢ | غ |
| ﴿ٱلۡحَكِيمُ﴾ إبراهيم: ٤ | ح |
| ﴿ٱلۡجِبَالُ﴾ الرعد: ٣١ | ج |
| ﴿ٱلۡكَبِيرُ﴾ الرعد: ٩ | ک |
| ﴿ٱلۡوَدُودُ﴾ البروج: ١٤ | و |
| ﴿ٱلۡخَبِيرُ﴾ سبأ: ١ | خ |
| ﴿ٱلۡفَوۡزُ﴾ التوبة: ٨٩ | ف |
| ﴿ٱلۡعَلِيمُ﴾ الأنبياء: ٤ | ع |
| ﴿ٱلۡقَمَرَ﴾ نوح: ١٦ | ق |
| ﴿ٱلۡيَاقُوتُ﴾ الرحمن: ٥٨ | ی |
| ﴿ٱلۡمُلۡكِ﴾ الفرقان: ٢ | م |
| ﴿ٱلۡهَوَىٰٓ﴾ النجم: ٣ | هـ |

## ٢- لامی شەمسی (اللاَّمُ الشَّمْسِيَّة):

لامی شەمسی ناخوێندرێتەوە تێکهەڵکێش دەکرێت لەگەڵ پیتەکەی دوای خۆی. پیتەکان کۆکراونەتەوە لە سەرەتای وشەکانی ئەم دێرە هۆنراوە:

طِبْ ثُمَّ صِلْ رَحِمًا تَفُزْ ضِفْ ذَا نِعَمْ
دَعْ سُوءَ ظَـنٍّ زُرْ شَرِيفًـا لِلْكَرَمْ

واتە: کەسێکی چاك بە پاشان پەیوەندی خزمایەتی بگەینە سەرفراز دەبیت، کەسی خاوەن بەهرە و نیعمەت میوانداری بکە، واز لە گومانی خراپ بێنە سەردانی کەسی ڕێزدار بکە بۆ چاکەکردن.

### ســـوود

پیتی دوای لامی شەمسی شەددە وەردەگرێت، وەک:

﴿وَٱلشَّمۡسِ﴾

## نموونەی لامی شەمسی (اللَّامُ الشَّمْسِيَّة):

| پیتەکان | نموونەکان |
|---|---|
| ط | ﴿ٱلطَّآمَّةُ﴾ النازعات: ٣٤ |
| ث | ﴿ٱلثَّوَابُ﴾ الكهف: ٣١ |
| ص | ﴿ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ الأعراف: ٧٠ |
| ر | ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ الفاتحة: ٣ |
| ت | ﴿ٱلتَّوَّابُ﴾ البقرة: ٣٧ |
| ض | ﴿ٱلضَّلَٰلُ﴾ الحج: ١٢ |
| ذ | ﴿ٱلذِّكۡرِ﴾ الأنبياء: ٧ |
| ن | ﴿ٱلنَّعِيمِ﴾ يونس: ٩ |
| د | ﴿ٱلدِّينُ﴾ الزمر: ٣ |
| س | ﴿ٱلسَّمَآءِ﴾ السجدة: ٥ |
| ظ | ﴿ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ البقرة: ١٤٥ |
| ز | ﴿ٱلزَّبُورِ﴾ الأنبياء: ١٠٥ |
| ش | ﴿ٱلشَّمۡسَ﴾ إبراهيم: ٣٣ |
| ل | ﴿ٱلَّيۡلَ﴾ الأنعام: ١٣ |

# راهێنان

پ١/ لامی ناساندن چەند جۆر حوکمی هەیە؟

١/.........................................................................................

٢/.........................................................................................

پ٢/ لە چ کاتێکدا لامی ناساندن ناخوێندرێتەوە؟

.......................................................................................................................................

.......................................................................................................................................

پ٣/ ئەم دێرە هۆنراوەی خوارەوە تەواو بکە؟

طِبْ ثُمَّ صِلْ رَحِمًا ........................................................................

.............................................................. زُرْ شَرِيفًا لِلْكَرَم





وانەی حەوتەم

# نون و میمی شەددەدار

(النُّونُ وَالميمُ المُشَدَّدَتانِ)

هەر کاتێك قورئانی پیرۆزمان خوێندەوە و گەیشتین بە نون و میمی شەددەدار، پێویستە ڕێژەی مینگە لە هەردوو پیت درێژبکەینەوە جا (ڕێژەی مینگە یەکسانە لە کاتی گەیاندن و وەستان لەسەر "نون ، میم").

نموونە:

﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَۚ﴾ الأنفال: ٤٣

﴿فَأَتَمَّهُنَّ﴾ البقرة: ١٢٤

﴿فِي ٱلۡيَمِّ وَلَا تَخَافِي﴾ القصص: ٧

﴿حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ﴾ المسد: ٤

﴿كَأَنَّهُنَّ﴾ الرحمن: ٥٨

﴿مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ﴾ الناس: ٦

فێرخوازی
خۆشەویست بزانە کە
ئەو (نون و میم)ـە ئامرازی شەددەیان ( ّ )
لەسەردانراوە، دەنگی مینگە
لەوپەڕی تەواوی دایە

نّ مّ

# مـینگـه ( الغُـنَّـة )

مینگە دەنگێکە لە بەشی بۆشایی ناوەوەی لوت دەردەچێت، ئەم سیفەتە لە هەموو کاتەکان لەگەڵ پیتی (نون) و (میم) دایە و جیانابێتەوە.











# حوكمەكانی
# نونی (ساكن) و (تنوين)

(أَحْكامُ النُّونِ السَّاكِنَـةِ والتَّنوينِ)

نونی (ساكن) و (تنوين)

( نْ ) ( ـٌ )، ( ـً )، ( ـٍ )

چوار جۆر حوكمی هەیە، كە بریتین لە:

**یەكەم:** ئاشكراكردن (الإظهار)

**دووەم:** تێكهەڵكێشان (الإدغام)

**سێیەم:** هەڵگەڕانەوە (القلب)

**چوارەم:** شاردنەوە (الإخفاء)

# حوکمەکانی نونی (ساکن) و (تنوین)

## یەکەم: ئاشکراکردن (الإظهار)

**لە زمانەوانیدا**: بریتیە لە ئاشکراکردن و دەرخستن.

**لە زاراوەدا**: بریتیە لە ئاشکرا کردن و خستنەرووی دەنگی ( نْ )ــی زەنەدار (ساکن) و تەنوین (( ـٌ )، ( ـً )، ( ـٍ )) بە مەرجێك یەکێ لە پیتەکانی (قورِگ)ــی بە دوایدا بێت کە بریتین لەم پیتانە: (همزة، ها، عین، حا، غین، خا)[1] کە لە سەرەتای ئەم وشانەدا کۆکراونەتەوە:

أَخِي هَاكَ عِلْماً حَازَهُ غَيْـرُ خَاسِرٍ

واتە: برام ها ئەوە زانستە ئەوەی بەدەستی دەهێنێ زەرەر ناکا.




[1] ئەم پیتانە بە پیتەکانی قورِگ (الحلق) ناسراون، چونکە هەر شەشیان لە قورِگدا دەردەچن.

## چەند نموونەیەك لەسەر ئاشكراكردنی نونی (ساكن) و (تنوين)دا :

| | | |
|---|---|---|
| (ء) ← | ﴿مَنۡ ءَامَنَ﴾ البقرة: ٦٢ | ﴿كُفُوًا أَحَدُۢ﴾ الاخلاص: ٤ |
| (هـ) ← | ﴿ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ البقرة: ٢٥ | ﴿وَلِكُلِّ قَوۡمٍ هَادٍ﴾ الرعد: ٧ |
| (ع) ← | ﴿أَنۡعَمۡتَ﴾ الفاتحة: ٧ | ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم﴾ الرعد: ٢٤ |
| (ح) ← | ﴿وَتَنۡحِتُونَ﴾ الشعراء: ١٤٩ | ﴿وَٰسِعًا حَكِيمًا﴾ النساء: ١٣٠ |
| (غ) ← | ﴿فَسَيُنۡغِضُونَ﴾ الإسراء: ٥١ | ﴿عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾ ابراهيم: ١٧ |
| (خ) ← | ﴿وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ﴾ الرعد: ١١ | ﴿كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ﴾ ابراهيم: ٢٦ |

## سـوود

١- ئاشكراكردن لە نونی (ساكن) لە یەك وشە و لە نێوان دوو وشەش ڕوودەدات، بەڵام لە (تنوين)ـدا ( ـً )، ( ـٍ )، ( ـٌ ) لە نێوان دوو وشە نەبێت ڕوونادات.

٢- نونـی (ساكن) لە ناوەڕاست و كۆتایی وشەدا دێت، بەڵام (تنوين) تەنها لە كۆتایی دێت.

٣- نونی (ساكن) پیتێكی سەربەخۆیە لە كاتی وەستان و گەیاندن دەمێنێ، بەڵام (تنوين) لەكاتی گەیاندن دەمێنێ و لە كاتی وەستان لە سەر وشەكە نامێنێ.

٤- مینگە (غـنـة) دەنگێكی مینگەدارە تەنها لە بۆشایی ناو لووت (بڕناخ - الخيشوم) دەردەچێت و ئەم سیفەتە تەنها لە پیتی(نون، میم)ــدا بەدی دەكرێت.

# راهێنان و چالاكی

پ١/ ئەم وشانە بخوێنەوە لەگەڵ ڕەچاوكردنی درێژكردنەوەی ڕێژەی مینگە (غنة)ی نون و میمی شەددەدار لەكاتی وەستان و گەیاندندا:

| | | |
|---|---|---|
| ﴿ فِي ٱلْيَمِّ ﴾<br>القصص: ٧ | ﴿ثُمَّ كَلَّا﴾<br>التكاثر:٤ | ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ﴾<br>النبأ: ١ |
| ﴿ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴾<br>المسد: ٤ | ﴿فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ﴾<br>النازعات: ٤١ | ﴿ فَأَتَمَّهُنَّ ﴾<br>البقرة: ١٢٤ |

پ٢/ بازنەیەک بکێشە بە دەوری ئەم وشانەی نونی زەنەدار (ساكن) و (تنوین) تیایاندا ئاشكرا دەكرێن:

| | | |
|---|---|---|
| ﴿ فَرِيقًا هَدَىٰ ﴾<br>الأعراف:٣٠ | ﴿أَنْعَمْتَ﴾<br>الفاتحة:٧ | ﴿ مِّن مَّسَدِۭ ﴾<br>المسد:٥ |
| ﴿عَن سَاقٍ﴾<br>القلم:٤٢ | ﴿وَيَنْـَٔوْنَ﴾<br>الأنعام:٢٦ | ﴿ مِنْ أَطْرَافِهَا ﴾<br>الرعد:٤١ |
| ﴿ بَشَرًا رَّسُولًا ﴾<br>الأسراء:٩٤ | ﴿وَتَنْحِتُونَ﴾<br>الشعراء:١٤٩ | ﴿وَمِنْ خَلْفِهِۦ﴾<br>الرعد: ١١ |

پ٣/ پیتەکانی ئاشکراکردن رەنگ بکە بە رەنگی سوور:

خ و ع ل

ر ب م ح

ف غ ن غ

ه ل ى



# حوکمەکانی نونی (ساکن) و (تنوین)

## دووەم: تێکهەڵکێشان (الإدغام)

له زمانەوانیدا: واته شتێك بخەیته ناو شتێکی ترەوە.

له زاراوەدا: بریتیه له بەیەك گەیشتنی دوو پیت، یەکەمیان زەنەدار (ساکن) بێت دووەمیان بزواو (متحرك) بێت، به شێوەیەك وەکو یەك پیتی توندو شەددەداری لێ بێت له جۆری پیتی دووەم.
پیتەکانی تێکهەڵکـێشانیش ئەمانەن: (یـا، را، میم، لام، واو، نون) که له وشەی (يَرْمُـلُونَ) دا کۆکراوەتەوە.

### ســـوود

شێوەی نونی زەنەدار (ساکن ) و ( تنوین ) لەکاتی تێکهەڵکێشان له قورئاندا بەم شێوەیه وێنەی کێشراوە: ( ن ) ( ـُـُ ) ، ( ـً ) ، ( ـٍ )

## ١

## تێکهەڵکێشانی مینگەدار (إدغام بغنـة)

ئەم جۆرە پیتەکانی بریتین لە (یا، نون، میم، واو).

چەند نموونەیەك لەسەر (إدغام بغنة):

(ي) ← ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ﴾ — دەخوێندرێتەوە ← فَمَـيَــــــيَعۡمَلۡ (یـا لەگەڵ مینگەیەکی درێژکراو)

(ن) ← ﴿فَلَن نَّزِيدَكُمۡ﴾

(م) ← ﴿خَيۡرٌ مِّنۡ﴾ — دەخوێندرێتەوە ← خَيۡرُ مُــــــمِنۡ (میم لەگەڵ مینگەیەکی درێژکراو)

(و) ← ﴿مِن وَالٍ﴾

## ئاگـــاداری!

ئەم تابلۆیە تەنها بۆ نزیککردنەوەیە، جێگەی دەماودەم ناگرێتەوە.

## ٢

## تێکهەڵکێشانی بێ مینگە (إدغام بلا غنـة)

ئەم جۆرەیان پیتەکانی بریتین لە (لام، را)، نموونە:

(ل) ← ﴿مِّن لَّدُنْهُ﴾ الكهف: ٢ — دەخوێندرێتەوە — مِـلَّـدُنْـهُ

(ر) ← ﴿مِن رَّبِّكَ﴾ البقرة: ١٤٧ — دەخوێندرێتەوە — مِـرَّبِّـكَ

(ل) ← ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ﴾ المطففين: ١ — دەخوێندرێتەوە — وَيْلُلِّـلْمُطَفِّفِينَ

(ر) ← ﴿بَشَرًا رَّسُولًا﴾ الإسراء: ٩٣ — دەخوێندرێتەوە — بَشَرَرَّسُولاً



## ئاگـــاداری!

### یەکەم:

نونی (ساکن) تێکهەڵکێش ناکرێت لەگەڵ پیتی (واو، یا) دا ئەگەر هاتوو لە یەك وشە کۆبونەوە، نموونە:

﴿قِنۡوَانٌ﴾ الأنعام: ٩٩ ﴿صِنۡوَانٌ﴾ الرعد: ٤

﴿ٱلدُّنۡيَا﴾ البقرة: ٨٦ ﴿بُنۡيَٰنٌ﴾ الصف: ٤

### دووەم:

نونی (ساکن) تێکهەڵکێش ناکرێت لەگەڵ پیتی (واو) دا لەکاتی گەیاندن لەم دوو جێگاو وشەیە دا:

﴿يسٓ ۝١ وَٱلۡقُرۡءَانِ﴾ يس: ١-٢

﴿نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ﴾ القلم: ١

## ســـوود

١- لە سەرەتای سورِەتی (يس) و سەرەتای سورِەتی (القلم) تێکهەڵکیشان روونادات، پێویستە (نون)ی ساکن ئاشکرا (الإظهار) بکرێت لە ڕیوایەتی (حفص من طريق الشاطبية).

٢- تەنها لە یەک شوێن لە قورئانی پیرۆز تێکهەڵکێشان روونادات لە پیتی (را)، وەکو: ﴿وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ﴾ القيامة: ٢٧.

چونکە هێمای (س) سەکتەی بۆ دانراوە لەسەر پیتی (نون)ی (ساکن) لە ڕیوایەتی (حفص من طريق الشاطبية) واجبە دەنگ بپچڕێنی بە بێ هەناسە.

# راهێنان و چالاکی

پ١/ پیتەکانی تێکهەڵکێشان (إِدغام بغنة) ڕەنگ بکە بە ڕەنگی سوور:






پ٢/ بازنەیەك بكێشە بەدەوری ئەم وشانەی كە تێكهەڵكێشانی بە مینگە (إِدغام بغنة) یان تێدایە:

| | | |
|---|---|---|
| ﴿فَرِيقًا هَدَىٰ﴾<br>الأعراف: ٣٠ | ﴿مِن تَسۡنِيمٍ﴾<br>المطففين: ٢٧ | ﴿مِّن مَّسَدِۭ﴾<br>المسد: ٥ |
| ﴿عَن سَاقٍ﴾<br>القلم: ٤٢ | ﴿أَمۡشَاجٍ نَّبۡتَلِيهِ﴾<br>الإنسان: ٢ | ﴿لَّئِن لَّمۡ يَنتَهِ﴾<br>الأحزاب: ٦٠ |
| ﴿بَشَرًا رَّسُولًا﴾<br>الإسراء: ٩٤ | ﴿أَن يَخۡسِفَ﴾<br>النحل: ٤٥ | ﴿مِن وَالٍ﴾<br>الرعد: ١١ |

پ٣/ ئایا تێكهەڵكێشان لەم وشانەدا روودەدات ؟

﴿قِنۡوَانٌ﴾......... ﴿صِنۡوَانٌ﴾.........

﴿ٱلدُّنۡيَا﴾......... ﴿بُنۡيَٰنٌ﴾.........



وانەی دەیەم

# حوکمەکانی نونی (ساکن) و (تنوین)

## سێیەم: هەڵگەڕانەوە (القلب)

له زمانەوانیدا: بریتیە لە گۆڕینی رووی شتێك بۆ روویەکی تر.

له زاراوەدا: بریتیە لە هەڵگەڕانەوەی دەنگی ( نْ ) و (ـــًـ) (ـــٍـ) (ـــٌـ) بۆ (میم)ـــێکی شـــاراوە بە تەواوی لە کاتی گەیشتنیان بە پیتی (بـــا) بە مەرجێك (مینگە)شی لەگەڵدا بێت.

### چەند نموونەیەك لەسەر هەڵگەڕانەوە (القلب):




**ســوود**

١- درێژکردنەوەی ڕێژەی مینگە لەبیر مەکە لەکاتی گۆڕینی پیتی (بـــا) بۆ (میم) لەم نموونانە و هاوێنەکانی دا.

٢- هەڵگەڕانەوە لە یەك وشە و لە نێوان دوو وشەش روودەدات.

وانەی یازدەم

# حوكمەكانی نونی (ساكن) و (تنوین)

## چـوارەم: شـاردنەوە (الإخفاء)

**لە زمانەوانیدا:** واتە شاردنەوەو دەرنەخستن.

**لە زاراوەدا:** بریتیە لە شاردنەوەی دەنگی نونی ساكن (ن) و ( تنوین ) ( ـٌـٌ ) ، ( ـًـ ) ، ( ـٍـ ) كـاتێـك دەگـەن بـە یــەكێـك لـەم (١٥) پیتـانەی خوارەوە :

(صاد، ذال، ثـا، كاف، جیم، شین، قاف، سین، دال، طا، زا، فـا، تـا، ضاد، ظا) بە مەرجێك مینگەی لەگەڵدا بێت.

پیتەكانی (الإخفاء) كــۆكراونەتەوە لە سەرەتای وشەكانی ئەم دێرە هۆنراوە:

صِفْ ذا ثَنا كَمْ جادَ شَخصٌ قَدْ سَما

دُمْ طَيِّباً زِدْ فـي تُقى ضَعْ ظالماً

واتە: باسی كەسێ بكە شیاوی ستایش كردنە، كەسانێ تێكۆشەر و شكۆدار بوون

لەسەر چاكە بەردەوام بە، پەرە بەتەقواكاری بدە، ستەمكار فەرامۆش بكە.

## چەند نموونەیەك لەسەر شاردنەوە (الإخفاء):

| | | | |
|---|---|---|---|
| (ت) | ← | ﴿مُنتَهَىٰهَآ﴾ النازعات: ٤٤ | ﴿نَارًا تَلَظَّىٰ﴾ الليل: ١٤ |
| (ث) | ← | ﴿مَّنثُورًا﴾ الفرقان: ٢٣ | ﴿مَآءً ثَجَّاجًا﴾ النبأ: ١٤ |
| (ج) | ← | ﴿أَنجَيْنَا﴾ هود: ١١٦ | ﴿عَيْنٌ جَارِيَةٌ﴾ الغاشية: ١٢ |
| (د) | ← | ﴿عِندَ رَبِّهِمْ﴾ القلم: ٣٤ | ﴿وَكَأْسًا دِهَاقًا﴾ النبأ: ٣٤ |
| (ذ) | ← | ﴿أَنذَرْنَٰكُمْ﴾ النبأ: ٤٠ | ﴿مِن ذِكْرَىٰهَآ﴾ النازعات: ٤٣ |
| (ز) | ← | ﴿أَنزَلْنَٰهُ﴾ القدر: ١ | ﴿مَن زَكَّىٰهَا﴾ الشمس: ٩ |
| (س) | ← | ﴿ٱلْإِنسَٰنُ﴾ الإنفطار: ٦ | ﴿عَن سَاقٍ﴾ القلم: ٤٢ |
| (ش) | ← | ﴿أَنشَرَهُۥ﴾ عبس: ٢٢ | ﴿شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ سبأ: ٤٧ |
| (ص) | ← | ﴿مَنصُورًا﴾ الإسراء: ٣٣ | ﴿بِرِيحٍ صَرْصَرٍ﴾ الحاقة: ٦ |



### ســوود

١- شاردنەوە لە یەك وشە و لە نێوان دوو وشەش روودەدات.

٢- دەنگی (الغنة) قەڵەو دەبێ ئەگەر لە دوایەوە پیتی بەرز هات، كە ئەمانەن: (صاد، ضاد، طا، ظا، قاف).

# پوختەی حوكمەكانی نونی (ساكن) و (تنوين)

| هەركاتێك نونی (ساكن) و (تەنوین) گەیشتن بە پیتێك لەم پیتانەی خوارەوە | حــوكمی |
|---|---|
| (أ، هـ، ع، ح، غ، خ) | ئاشكراكردن<br>(إظهار) |
| (ي، ن، م، و) | تێكهەڵكێشانی بە مینگە<br>(إدغام بغنة) |
| (ل، ر) | تێكهەڵكیشانی بێ مینگە<br>(إدغام بلا بغنة) |
| (ب) | هەڵگەڕانەوە<br>(قلب) |
| (ت، ث، ج، د، ذ، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ف، ق، ك) | شاردنەوە<br>(إخفاء) |

## راهێنان

**پ١/ پێناسەی هەڵگەڕانەوە (القلب) بنووسە:**

لە زمانەوانیدا: ..........................................................................................

**پ٢/ پیتەکانی شاردنەوە (الإخفاء) چەندن بیاننووسە:**

پیتەکانی شاردنەوە بریتین لە: ....................................................................

..........................................................................................................

**پ٣/ دوو نموونە بنووسە بۆ هەریەك لە حوكمەكانی هەڵگەڕانەوە و شاردنەوەی نونی (ساكن) و (تنوین):**

نموونەی هەڵگەڕانەوە ( ................................ ) ( ................................ )

نموونەی شاردنەوە ( ................................ ) ( ................................ )



# حوکمەکانی میمی (ساکن)

## (أحكامُ المِيمِ السّاكِنَـة)



# حوكمەكانی میمی (ساكن)

## یەكەم: تێكهەڵكێشانی لێوی (الإدغام الشفوي):

بریتیە لە تێكهەڵكێش كردنی میمی (ساكن) لە كاتی گەیشتن بە میمێكی تر. چەند نموونەیەك:

﴿عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا﴾ نوح: ١١ ﴿أَنَّهُم مَّبۡعُوثُونَ﴾ المطففين: ٤

﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ المائدة: ٢٣



وانەی چواردەم

# حوکمەکانی میمی (ساکن)

## دووەم: شاردنەوەی لێوی (الإخفاء الشفوي):

بریتیە لە شاردنەوەی میمی (ساکن) لە کاتی گەیشتنی بە پیتی (بـــا).
چەند نموونەیەك:

﴿يَأۡتِيكُم بِمَآءٖ﴾ الملك: ٣٠ ﴿هُم بِٱلسَّاهِرَةِ﴾ النازعات: ١٤

خشتەی نموونەکانی شاردنەوەی (میم)ــی (ساکن):

| پـیـت | نموونـە | سورەت |
| --- | --- | --- |
| م + بِ | ﴿تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٖ﴾ | الفيل: ٤ |
| م + بَ | ﴿هُم بَٰرِزُونَ﴾ | غافر: ١٦ |
| م + بُ | ﴿دَخَلۡتُم بُيُوتٗا﴾ | النور: ٦١ |

## ســـوود

١- شاردنەوەی لێوی تەنها لە نێوان دوو وشە ڕوودەدات.

٢- درێژکردنەوەی ڕێژەی مینگە لە بیرمەکە لە کاتی شاردنەوە (الإخفاء).

٣- شێوەی دوو لێوەکان لە کاتی دەربڕینی (میم)ـی شاراوە بە گەیاندنی لێوەکان بە بێ بوونی فشار و بۆشایی هێشتنەوە لە نێوان لێوەکاندا.





وانەی پازدەم

# حوکمەکانی میمی (ساکن)

## سێیەم: ئاشکراکردنی لێوی (الإظهار الشفوي):

بریتیە لە ئاشکراکردنی میمی زەنەدار (ساکن) لە کاتی گەیشتنی بە پیتێک لە (٢٦) پیتەکانی زمانی عەرەبی جگە لە پیتەکانی (میم، بــا).

چەند نموونەیەك:

﴿لَهُمْ جَنَّٰتٍ﴾ البقرة: ٢٥ ﴿أَيُّكُمْ أَحْسَنُ﴾ الملك: ٢

﴿وَهُمْ فِيهَا﴾ البقرة: ٢٥ ﴿خَلَقْنَٰهُمْ وَشَدَدْنَآ﴾ الإنسان: ٢٨

﴿أَنْعَمْتَ﴾ النمل: ١٩ ﴿فَدَمْدَمَ﴾ الشمس: ١٤ ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ﴾ المرسلات: ٢٥

### ســـوود

١- ئاشکراکردنی لێوی لە یەك وشە و لە نێوان دوو وشەش روودەدات.

٢-پێویستە فێرخواز وریا بێت میمی (ساکن) نەشارێتەوە لە کاتی گەیشتنی بە پیتی (فـا، واو).

## پوختەی حوکمەکانی میمی (ساکن):

١- میمی (ساکن) تێکهەڵکێش دەکرێت لە کاتی گەیشتنی بە میمێکی تری بزواو (میم متحرك).

٢- میمی (ساکن) دەشاردرێتەوە لە کاتی گەیشتنی بە پیتی (بـا).

٣- میمی (ساکن) ئاشکرا دەکرێت لە کاتی گەیشتنی بەم پیتانە (ء، ت، ث، ج، ح، خ، د، ذ،ر، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ،ع، غ، ف، ق، ل، ك، ن، هـ، و، ي).



## راهێنان و چالاکی

ئەم دوو سورەتە بە وردی بخوێنەوە دواتر ئەو پرسیارانەی لێت دەکرێت وەڵامیان بدەوە:

### سُورَةُ الفِيلِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِى تَضْلِيلٍ ﴿٢﴾ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍۭ ﴿٥﴾

### سُورَةُ قُرَيْشٍ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ ﴿١﴾ إِۦلَٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ ﴿٢﴾ فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ﴿٣﴾ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ﴿٤﴾

پ١/ حوکمەکانی میمی (ساکن) لەم خشتەیەی خوارەوەدا بنووسە کە لەم دوو سورەتە هاتوون:

| تێکهەڵکێشانی لێوی (الإدغام الشفوي) | شاردنەوەی لێوی (الإخفاء الشفوي) | ئاشکرا کردنی لێوی (الإظهار الشفوي) |
|---|---|---|
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |

پ٢/ ئەو دوو پیتە بنووسە کە پێویستە میمی (ساکن) نەشارینەوە لە حوکمی ئاشکراکردندا: ( ............ ، ............ )





## پلەکانی مینگە (مَراتبُ الغُنَّـةِ)




### پلەی یەکەم: لەوپەڕی تەواویدایە (أكمل ما تكون):

لە پیتی (نّ ، مّ)ی توند و شەددەدار لەوپەڕی تەواویدایە.

نموونە:

﴿كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ﴾ المرسلات: ٣٣ ﴿ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ﴾ النبأ: ٥

لە تێکهەڵکێشانی (نون) لەگەڵ (نون)ـدا و (میم) لەگەڵ (میم)ـشدا (مینگە) لەوپەڕی تەواویدایە.

نموونە:

﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ﴾ الملك: ١٦ ﴿فَلَن نَّزِيدَكُمْ﴾ النبأ: ٣٠

﴿كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ﴾ المطففين: ٩

## پلەی دووەم: تەواو (كامل):

لە سێ حوكمدا مینگە تەواوە:

أ- لە كاتی (الإدغام) تێكهەڵكێشكردنی نونی (ساكن) و (تنوين) لەگەڵ پیتەكانی (واو ، یـا).

نموونە:

﴿شَيْـًٔا وَلَا يُنقِذُونِ﴾ يس: ٢٣ ﴿أَفَمَن يَمْشِي﴾ الملك: ٢٢

ب- لە كاتی (الإخفاء) شاردنەوەی (میم ، نون)ی (ساكن).

نموونە:

﴿أَنشَأَكُمْ﴾ الملك: ٢٣ ﴿فَمَن يَأْتِيكُم بِمَاءٍ مَّعِينٍ﴾ الملك: ٣٠

ج- لە كاتی هەڵگەڕانەوەی (نون)ی (ساكن) و (تنوين) بۆ پیتی (میم) بە تەواوی.

نموونە:

﴿عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ﴾ القلم: ١٣

﴿مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ﴾ الجن: ٢٧

﴿لَيُنۢبَذَنَّ﴾ الهمزة: ٤

## پلەی سێیەم: نـاتەواو (ناقص):

لە کاتی ئاشکراکردنی (الإظهار) دەنگی (نون ، م)ی (ساکن) ناتەواوە.

نموونە:

﴿مِنۡهُ﴾ المزمل: ٣ ﴿وَٱهۡجُرۡهُمۡ هَجۡرٗا﴾ المزمل: ١٠

## پلەی چوارەم: نـاتەواوترین (أنقص):

لە (نون ، میم)ی جووڵەدار کەمترین پلەی (مینگە)ی هەیە.

نموونە:

﴿يَوۡمَ﴾ المزمل: ١٤ ﴿نُقِرَ﴾ المدثر: ٨ ﴿ذَرۡنِي﴾ المدثر: ١١



## ڕاهێنان و چالاکی

پ١/ پلەکانی مینگە (غنة) چەند جۆرن بیانژمێرە:

١- ......................................................................................................

٢- ......................................................................................................

٣- ......................................................................................................

٤- ......................................................................................................



پ٢/ لەم خشتەیەی خوارەوە لە بەرامبەر نموونەکان جۆری پلەکانی مینگە (غنة) دیاری بکە:

| جۆری مینگە (أنواعُ الغنَّـة) | نموونە | پیت |
|---|---|---|
| | ﴿مَن يَخۡشَىٰهَا﴾ النازعات: ٤٥ | ن |
| | ﴿أَنۡعَمۡتَ﴾ الفاتحة: ٧ | ن - م |
| | ﴿فَأَنتَ﴾ عبس: ٦ | ن |
| | ﴿حَمَّالَةَ﴾ المسد: ٤ | م |
| | ﴿نُصِبَتۡ﴾ الغاشية: ١٩ | ن |
| | ﴿لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ﴾ النازعات: ٤٦ | م |
| | ﴿بِٱلۡخُنَّسِ﴾ التكوير: ١٥ | ن |



وانەی حەڤدەم

# حوكمەكانی درێژكردنەوە (أحكام المدُود):

پێناسەی ( المَــدّ ) درێژكردنەوە:-

لە زمانەوانیدا: درێژكردنەوە، زیادكردن.

لە زاراوەدا: بریتیە لە درێژكردنەوەی دەنگ بە پیتێك لە پیتەكانی (المَدّ) كە بریتین لە:

١- ئەلیفی زەنەدار (ساكن) سەرە (فتحة)ی لە پێش هاتبێت.

٢- واوی زەنەدار (ساكن) بۆرە (ضمة)ی لە پێش هاتبێت.

٣- یائی زەنەدار (ساكن) ژێرە (كسرة)ی لە پێش هاتبێت.

نموونەی هەر سێ پیتە درێژكراوەكە لە فەرمایشتی خودای پەروەردگاردا: ﴿نُوحِيهَآ﴾ هود: ٤٩.



## جۆرەکانی درێژکردنەوە
## (أنواعُ المدُود)

نۆ جۆرە درێژکردنەوە لە کتێبی خودای پەروەردگار هاتووە:

١- درێژکردنەوەی سروشتی (المدُّ الطبيعي).

٢- درێژکردنەوەی گۆڕاو (مَدُّ البَدَل).

٣- درێژکردنەوەی لە بری (مَدُّ العِوَض).

٤- درێژکردنەوەی گەیاندن (مَدُّ الصِّلة).

٥- درێژکردنەوەی بەیەکگەیشتوو (المَدُّ المتَصِل).

٦- درێژکردنەوەی جودا (المَدُّ المنْفَصِل).

٧- درێژکردنەوەی پێویست (المَدُّ اللاّزم).

٨- درێژکردنەوە بەهۆی (سکون)ی تووشهاتوو (المَدُّ العَارِض للسكُون).

٩- درێژکردنەوەی ئاسان (مَدُّ اللّين).

پشتیوان بە خوا چوار جۆر لە (مَدّ)ەکان پێناسە دەکەین و دەناسێنین.

## ١

## درێژکردنەوەی سروشتی
## (المدُّ الطبيعي)

بریتیە لە درێژکردنەوەی (ـَـا، ـُـو، ـِـي) کە لە دوایەوە (همزة) یان (سکون) نەهاتبێت.

نموونە:

(ـَـا)  ﴿قَالَا﴾ طه: ٤٥ ﴿وَٱرۡحَمۡنَا﴾ المؤمنون: ١٠٩

(ـُـو)  ﴿بُورِكَ﴾ النمل: ٨ ﴿فَأَكۡثَرُواْ﴾ الفجر: ١٢

(ـِـي)  ﴿تَجۡرِي﴾ الزمر: ٢٠ ﴿سِنِينَ﴾ المؤمنون: ١١٢.

## ســـوود

١- درێژکردنەوەی سروشتی لە کاتی گەیاندن و وەستان هەر بە ئەندازەی دوو جووڵە ( حَرَكَة ) درێژدەکرێتەوە.

٢- ئەندازەی دوو جووڵە بریتیە لە دەربڕینی یەك ئەلیف، یان بە ئەندازەی دوو پیتی جوڵاو، وەك: (تَ تَ) یا (قَ قَ).

## راهێنان و چالاکی

پ١/ پیتی گونجاو (یا، أَلِف، واو) لەم بۆشاییانەی خوارەوە دابنێ؟

١- ....... ی زەنەدار (ساکن) سەرە (فتحة)ی لە پێش هاتبێت.

٢- ....... ی زەنەدار (ساکن) بۆرە (ضمة)ی لە پێش هاتبێت.

٣- ...... ی زەنەدار (ساکن) ژێرە (کسرة)ی لە پێش هاتبێت.

پ٢/ لاکێشەیەك بکێشە بەدەوری ئەم نموونانەی کە هەر سێ پیتی درێژکردنەوەی سروشتییان تیادا هاتووە:

﴿قَالَا﴾ طه: ٤٥ ﴿أَتُجَٰدِلُونَنِي﴾ الأعراف: ٧١ ﴿تُدِيرُونَهَا﴾ البقرة: ٢٨٢

﴿أُوذِينَا﴾ الأعراف: ١٢٩ ﴿ٱلطَّآمَّةُ﴾ النازعات: ٣٤ ﴿بُورِكَ﴾ النمل: ٨

﴿نُوحِيهَآ﴾ هود: ٤٩ ﴿يَخْشَى﴾ فاطر: ٢٨.

پ٣/ ئەم بۆشاییانە پڕ بکەوە:

ئەندازەی دوو جووڵە بریتیە لە ......................... ، یان بە ئەندازەی دوو پیتی جوڵاو، وەك: ( .......... ) یان ( ........... ).

٢

وانەی هەژدەم

# درێژکردنەوەی بەیەکگەیشتوو (المدُّ المتصل)

بریتیە لە درێژکردنەوەی پیتەکانی (المَدّ) بە مەرجێك لە دواپەوە پیتی (همزة) هاتبێت و لە ناو یەك وشەدا بە یەك بگەن، لەم کاتەدا پێویستە دەنگ درێژ بکرێتەوە بە ئەندازەی (٤ یان ٥) جووڵە (حركة).

نموونە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| (ـَ اء) | ← | ﴿حُنَفَآءَ﴾ البينة: ٥ | ﴿وَسَآءَ﴾ النساء: ٢٢ |
| (ـُ وء) | ← | ﴿سُوٓءٍ﴾ طه: ٢٢ | ﴿لِيَسُـُٔوا۟﴾ الاسراء: ٧ |
| (ـِ يء) | ← | ﴿سِيٓءَ﴾ هود: ٧٧ | ﴿خَطِيٓـَٔتِكُمْ﴾ الأعراف: ١٦١ |



٣

## وانەی نۆزدەم

# درێژکردنەوەی جودا (المدُّ المنُفَصل)

بریتیە لەوەی کە پیتی درێژکردنەوە (المَدّ) لە کۆتایی وشەی یەکەم بێت، وە پیتی (همزة) لە سەرەتای وشەی دووەم بێت بە مەرجێك ڕانەوەستی لەسەر وشەی یەکەم[1] ئینجا دەبێتە درێژکردنەوەی دەنگ بە ئەندازەی (٤ یان ٥) جووڵە.

نموونە:

﴿وَحُلُّوٓا۟ أَسَاوِرَ﴾ الإنسان: ٢١ ﴿وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا﴾ البينة: ٥

﴿بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ﴾ يوسف: ٣ ﴿ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم﴾ قريش: ٤

[1] لە دوو وشە

## ســـوود

ئەگەر وەستاین لەسەر وشەی یەکەم درێژکردنەوەکە نامێنێت و دەبێت بە (مـدّ)ی سروشتی.



وانەی بیستەم

٤

## درێژکردنەوەی پێویست
## (المدُّ اللازم)

بریتیە لە هاتنی پیتێکی شەددەدار یان (ساکن)ێکی بنەڕەتی لە دوای پیتی درێژکردنەوە، لەو کاتە پێویستە بە ئەندازەی (٦) جووڵە درێژبکرێتەوە.

نموونە:

﴿ٱلطَّآمَّةُ﴾ النازعات: ٣٤ ﴿ٱلضَّآلِّينَ﴾ البقرة: ١٩٨ ﴿دَآبَّةٍ﴾ الأنعام: ٣٨

﴿يُوَآدُّونَ﴾ المجادلة: ٢٢ ﴿ٱلۡحَآقَّةُ﴾ الحاقة: ١ ﴿تَأۡمُرُوٓنِّيٓ﴾ الزمر: ٦٤

﴿أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي﴾ الأنعام: ٨٠

### ســوود

درێژکردنەوەی (اللازم) لە کاتی گەیاندن و وەستاندا شەش جووڵە درێژ دەکرێتەوە.



## راهێنان و چالاكی

پ١/ وشەی گونجاو هەڵبژێرە لەم بۆشاییانەی خوارەوەدایبنێ:

سروشتی (الطبيعي)، بەیەك گەیشتوو (المتصل)،
جودا (المنفصل)، پێویست (اللازم)

١- درێژكردنەوەی ........................ بە ئەندازەی (٦) جووڵە درێژ دەكرێتەوە.

٢- درێژكردنەوەی ........................ بە ئەندازەی (٤) جووڵە درێژدەكرێتەوە.

٣- درێژكردنەوەی ........................ بە ئەندازەی (٢) جووڵە درێژدەكرێتەوە.

٤- درێژكردنەوەی ........................ بە ئەندازەی (٤) جووڵە درێژدەكرێتەوە.

پ٢/ ئەم وشانە بە رەنگی سوور رەنگ بكە كە حوكمی درێژكردنەوەی (بەیەك گەیشتوو و جودا و پێویست)ـی تێدا جێبەجێ دەبێت ؟

(الحَاقَّةُ) (سِينِ) (الَّذِي أَطْعَمَهُم)

(بُورِكَ) (حُنَفَاءَ) (تَجْرِي)

# هــەژان (القلقلة)

له زمانەوانیدا : (هــەژان).

له زاراوەدا: بریتیە له دەرچــوونی پیتی هـــەژان (القلقلة) له باری زەنـــەدار (ســاکــن) به دوورکەوتنەوەی نێوان هەردوو ئەندامی دەربڕین به بێ ئەوەی هیچ جوڵەیەکی له گەڵدا بێ له هەر سێ جۆرەکان (ضــمة، کســرة، فتــحة)، وه پیتەکانی پێنج پیتن کۆکراونەتەوه له وشەی (قُـطُـب جَـد).



هەژان دەبێت به دوو جۆر:
١- هەژانی گەورە (القلقلةُ الکبری).
٢- هەژانی بچووک (القلقلةُ الصُّغری).

١

## هەژانی گەورە ( القلقلة الكبرى )

ئەم جۆرەیان لەو کاتەدا ڕوودەدا کە پیتی هەژان (القلقلة) لە کۆتایی وشەدا بێت و بوەستی لە سەری جا شەددەدار بێت یان بێ شەددە.

نموونە:

﴿وَتَبَّ﴾ المسد: ١، ﴿حَسَدَ﴾ الفلق٥ ، ﴿وَقَبَ﴾ الفلق٣، ﴿أَشَدَّ﴾ البقرة: ٢٠٠

٢

## هەژانی بچووك ( القلقلة الصغرى )

ئەم جۆرەیان لەو کاتەدا ڕوودەدا کە پیتی هەژان (القلقلة) لەناوەڕاستی وشەدا بێت یان لە ناو ڕستەدا بێت.

نموونە:

﴿فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا﴾ الأعراف:١٣، ﴿وَيُبۡصِرُونَ﴾ القلم:٥، ﴿وَأَجۡرٌ﴾ الملك:١٢.

# راهێنان و چالاكی

پ١/ پیتەكانی هەژان (القلقلة) چەند پیتن بیاننووسە ؟

( ............................................................... )

پ٢/ لەبەرامبەر وشەكان جۆری هەژان (القلقلة)ی گەورە و بچووك (القلقلةُ الكبرى)، (القلقلةُ الصُّغرى) دیاری بكە:

﴿أَمۡ حَسِبۡتَ﴾..................... ﴿وَتَبَّ﴾.............. ﴿وَقَبَ﴾ .................

﴿كَسَبَ﴾ .................................. ﴿حَسَدَ﴾ ..............................

﴿أَشَدَّ﴾ .............................. ﴿وَيُبۡصِرُونَ﴾ ..............................

﴿فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا﴾ ......................... ﴿وَأَجۡرٌ﴾ ..............................



# شێوازی خوێندنەوەی پیتەکانی (لام ، را ، ألِف)

لە زمانی عەرەبیدا سێ پیت هەن
لە خودی خۆیاندا ناسکن بەڵام
بە هۆکار سیفەتی قەڵەوی وەردەگرن
لە هەندێ کاتیش بە لاوازی
دەخوێندرێنەوە کە بریتین لە:

١- (لام)
٢- (را)
٣- (أَلِف)

وانەی بیست و دوو

# حوکمی پیتی (لام) لە ناوی پیرۆزی (الله)

## (لام لفظ الجلالة)

**یەکەم:** (لام) لە ناوی پیرۆزی (الله) بە قەڵەوی دەخوێندرێتەوە ئەگەر هاتوو (ضمة) یان (فتحة)ی لە پێش هاتبوو.

**نموونە:**

﴿عَبۡدُ ٱللَّهِ﴾ مريم: ٣٠ ﴿وَٱللَّهِ﴾ الأنعام: ٢٣

شێوە و وێنەی زمان لە دەربڕینی پیتی ( لام )ـی قەڵەو



لەگەڵ پیتی ( لام )ـی قەڵەو ناوەڕاستی زمان چـاڵ دەبێت و تەنگییەك لە قوڕگ دروست دەبێت.

دووەم: (لام) لە ناوی پیرۆزی (الله) بە لاوازی دەخوێندرێتەوە ئەگەر هاتوو (کسرة) یان (تنوین)ی لە پێش هاتبوو .

نموونە: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ﴾ الفاتحة: ١ ﴿فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا﴾ النصر: ٢.

﴿قَوۡمًا ٱللَّهُ﴾ الأعراف ١٦٤، بە ﴿قومَنِ اللّـه﴾ دەخوێندرێتەوە.

شێوە و وێنەی زمان لە دەربڕینی پیتی (لام)ـی لاواز



لەگەڵ پیتی (لام)ـی لاواز ناوەڕاستی زمان چـاڵ نابێت و هیچ تەنگییەك لە قوڕگ دروست نابێت بە پێچەوانەی (لام)ـی قەڵەو.

وانەی بیست و سێ

# چۆنیەتی خوێندنەوەی پیتی (را)

## یەکەم: خوێندنەوەی پیتی (را) بە قەڵەوی:

١- ئەگەر پیتی را (ساكن) بوو، پێشی ( فتحة )بوو، نموونە:

﴿قَرۡنٍ﴾ الأنعام: ٦ ﴿مَّرۡجِعُهُمۡ﴾ الأنعام: ١٠٨

٢- ئەگەر پیتی را (فتحة)ی لەسەر بوو، نموونە:

﴿أَرَءَيۡتَ﴾ الماعون: ١ ﴿زَجۡرَةٞ﴾ النازعات: ١٣

٣- ئەگەر پیتی را (ساكن) بوو پێشەكەی (ضمة)بوو، نموونە:

﴿مُرۡسَىٰهَا﴾ النازعات: ٤٢

٤- ئەگەر پیتی را (ضمة)ی لەسەر بوو، نموونە:

﴿ٱلرُّوحُ﴾ النبأ: ٣٨

شێوە و وێنەی زمان لە دەربڕینی پیتی (را)ـی قەڵەو



لە دەربڕینی پیتی (را)ـی قەڵەو ناوەڕاستی زمان چـاڵ دەبێت و تەنگییەك لە قوڕگ دروست دەبێت.

## دووەم : خوێندنەوەی پیتی (را) بە لاوازی:

١- ئەگەر پیتی را (ساكن) بوو پێشەكەی (كسرة)ی بنەڕەتی (أصلي) بێت، نموونە:

﴿وَٱغۡفِرۡلَنَآ﴾ التحريم: ٨ ﴿فِرۡعَوۡنَ﴾ النازعات: ١٧

﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ﴾ النصر: ٣ ﴿فَبَشِّرۡهُم﴾ الانشقاق: ٢٤

٢- ئەگەر پیتی را (كسرة)ـە بوو، نموونە:

﴿رِزۡقًا﴾ البقرة: ٢٢ ﴿مِن شَرِّ مَا خَلَقَ﴾ الفلق: ٢

٣- ئەگەر پیتی را (ساكن) بێت پێشی (يا)یەكی (ساكن) بوو، نموونە:

﴿خَيۡرٌ﴾ النحل: ٣٠ ﴿قَدِيرٌ﴾ الملك: ١ ﴿ٱلسَّعِيرِ﴾ الملك: ١١

شێوە و وێنەی
زمان لە دەربڕینی پیتی
(را)ـی لاواز



لە دەربڕینی پیتی (را)ـی لاواز ناوەڕاستی زمان چاڵ نابێت و هیچ تەنگییەك لە قوڕگ دروست نابێت بە پێچەوانەی (را)ـی قەڵەو.

وانەی بیست و چوار

# چۆنیەتی خوێندنەوەی پیتی (أَلِف)

پیتی (أَلِف) لە رووی سیفەتی بەرزی (الاستعلاء) یان نزمی (الاستفال) وەکو پیتەکانی پێش خۆیەتی.

**یەکەم:** پیتی (أَلِف) بە قەڵەوی دەخوێندرێتەوە ئەگەر لە دوای پیتی بەرزی بێت کە بریتین لە حەوت پیت (خُصَّ ضَغطٍ قِـظ).



شێوە و وێنەی زمان لە دەربڕینی پیتی (أَلِف)ـی قەڵەو

لە دەربڕینی پیتی (أَلِف)ـی قەڵەو ناوەڕاستی زمان چاڵ دەبێت و تەنگییەك لە قوڕگ دروست دەبێت.

## خشتەی نموونەکانی (أَلِف)ی قەڵەو[1]

| پیت | نموونە | سورەت |
|---|---|---|
| خ + أَلِف | ﴿خَاسِرَةٌ﴾ | النازعات: ١٢ |
| ص + أَلِف | ﴿ٱلصَّآخَّةُ﴾ | عبس: ٣٣ |
| ض + أَلِف | ﴿ٱلضَّآلِّينَ﴾ | الفاتحة: ٧ |
| غ + أَلِف | ﴿بِغَٰفِلٍ﴾ | البقرة: ٧٤ |
| ط + أَلِف | ﴿ٱلطَّآمَّةُ﴾ | النازعات: ٣٤ |
| ق + أَلِف | ﴿مَقَامَ رَبِّهِۦ﴾ | النازعات: ٤٠ |
| ظ + أَلِف | ﴿ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ | ابراهيم: ٤٢ |

(١) أ- هەروەکو لە پێشتر ئاماژەمان بە پیتی (را) کرد سیفەتی قەڵەوی و نزمی وەردەگرێت.
واتە: لەو شوێنانە پیتی (را) قەڵەو بوو کە پیتی (ألف)ی بەدواوە هات ئەوە (ألفّ)ەکەش بە قەڵەوی دەخوێندرێتەوە.
ب- بە هەمان شێوە لامی (لفظ الجلالة) لە کاتی خوێندنەوەی بە قەڵەوی (ألف)ی دوای بە قەڵەوی دەخوێندرێتەوە.

# چۆنیەتی خوێندنەوەی پیتی (أَلِف)

**دووەم:** پیتی (أَلِف) بە لاوازی دەخوێندرێتەوە ئەگەر لە دوای پیتی نزمی (الاستفَال) هات.



شێوە و وێنەی زمان لە دەربڕینی پیتی (أَلِف)ـی لاواز

لە دەربڕینی پیتی (أَلِف)ـی لاوازدا ناوەڕاستی زمان چــاڵ نابێت و هیچ تەنگییەك لە قوڕگ دروست نابێت بە پێچەوانەی (أَلِف)ـی قەڵەو.

# خشتەی نموونەکانی (أَلِف)ی لاواز

| پیت | نموونە | سورەت |
|---|---|---|
| م + أَلِف | ﴿بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ | التغابن: ٢ |
| ذ + أَلِف | ﴿بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ | التغابن: ٤ |
| ب + أَلِف | ﴿وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ﴾ | التغابن: ٥ |
| ك + أَلِف | ﴿كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ﴾ | التغابن: ٦ |
| ح + أَلِف | ﴿فَحَاسَبۡنَٰهَا﴾ | الطلاق: ٨ |
| ء + أَلِف | ﴿ءَامَنُواْ﴾ | التحريم: ١١ |
| ن + أَلِف | ﴿فَنَفَخۡنَا﴾ | التحريم: ١٢ |
| ت + أَلِف | ﴿كَانَتَا﴾ | التحريم: ١٠ |

## ڕاهێنان و چالاكی

ئەم دوو سورەتە بە وردی بخوێنەوە دواتر ئەو پرسیارانەی لێت دەكرێت وەڵامیان بدەوە:

### سُورَةُ الفَاتِحَة

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١
ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢
ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤
إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥ ٱهۡدِنَا
ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ
عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ
وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧

### سُورَةُ الإِخۡلَاص

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ٣
وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ٤

پ١/ چەند نموونەیەك لە حوكمەكانی(لام) لە ناوی خودا (لام لفظ الجلالة) لەم خشتەی خوارەوە دا بنووسە كە لە هەردوو سورەتەكە هاتوون:

| (لام )ــی قەڵەو لە ناوی پیرۆزی خودا | (لام )ــی لاواز لە ناوی پیرۆزی خودا |
| --- | --- |
| | |
| | |
| | |

پ٢/ بازنەیەك بكێشە بەدەوری ئەو وشانەی كە پیتی (أَلِف) تیایدا بەقەڵەوی دەخوێندرێتەوە:



پ٣/ هێمای ( ✔ ) بەرامبەر دەستەواژەی دروست و هێمای ( ✘ ) بەرامبەر دەستەواژەی نادروست دابنێ؟

أ / پیتی (را) لەم حاڵەتانەدا بە قەڵەوی دەخوێندرێتەوە:

١- ئەگەر پیتی را (ساکن) بوو پێشەکەی (کسرة)ـەی بنەڕەتی (أصلي) بێت. ◯

٢- ئەگەر پیتی را (ساکن) بوو پێشی (فتحة)ـە بوو. ◯

٣- ئەگەر پیتی را (فتحة)ـەی لەسەر بوو. ◯

٤- ئەگەر پیتی را (ضمة)ـەی لەسەر بوو. ◯

ب / پیتی (را) لەم حاڵەتانەدا بە لاوازی دەخوێندرێتەوە:

١- ئەگەر پیتی را (ساکن) بوو پێشی (یا)یەکی (ساکن) بێت. ◯

٢- ئەگەر پیتی را (ساکن) بوو پێشەکەی (ضمة)ـە بوو. ◯

٣- ئەگەر پیتی را (کسرة)ـە بوو. ◯



# نیشانەکانی وەستان لە قورئانی پیرۆزدا




(١) بریتیە لە کۆبوونەوەی دوو وەستان لە یەك شوێن، لەم حاڵەتەش ئەتوانی تەنها لەسەر یەکێکیان بوەستی، وە نابێ لە یەك کاتدا لەسەر هەردووکیان بوەستی.

# فەرهەنگی وشە لە زانستی ( تجويد ) دا

| وشـــە | واتـــــا |
|---|---|
| الاستعاذة | خۆ پەنادان |
| البسملة | ناوی خودا هێنان |
| حَقَّهُ | ماڤی پیت: بریتیە لەپێدانی ماڤی هەموو پیتێك لەرووی دەرچە وسیفەتەوە |
| مُسْتَحَقَّهُ | ئەوەی شیاوە بۆ پیت: بریتیە لەپێدانی ئەو سیفەتانەی کە تووشی پیتەکە دەبن |
| الهَمس | چرپە: بریتیە لە رۆیشتنی هەوای هەناسە لەکاتی دەربڕینی پیتەکە لەشوێنی دەرچوونی |
| الجَهر | ئاشکراکردن: بریتیە لەدەرنەچوونی هەوای هەناسە لەکاتی دەربڕینی پیتەکە لەشوێنی دەرچوونی |
| التَّفْخِيم | قەڵەو کردن |
| التَّرْقِيق | لاواز کردن |
| المَدّ | درێژکردنەوەی دەنگ |
| السَّكت | بێدەنگبوون: بریتیە لە بڕینی دەنگ، وەستانێکی کەم لەسەر پیتێکی قورئانی پیرۆز بەبێ هەناسەدان بەمەبەستی دەستپێکردنەوەی خوێندنەوەکە |
| نظري | بیرەکی (تیۆری) |
| فَتحة | سەرە (ـَ) |
| كَسرة | ژێرە (ـِ) |
| ضَمة | بۆرە (ـُ) |
| ساكن | زەنەدار (وەستاو) |
| مُتَحرِك | بزواو |
| تنوين | (دوو سەرە ـً ، دوو ژێرە ـٍ ، دوو بۆرە ـٌ) |
| الأحْرفُ اللِّثَوِيَّة | پیتەکانی پووك |
| طَرَفُ اللِّسان | پێشەوەی زمان |

## فەرهەنگی وشە لە زانستی ( تجوید ) دا

| وشـە | واتـــا |
|---|---|
| لامُ التَّعْرِيف | لامی ناساندن |
| الخَيْشوم | بۆشایی ناو لووت (برِناخ) |
| الغُنَّة | مینگە |
| الإظهار | ئاشکراکردن – بەدیار خستن |
| الإدغام | تێکهە ڵکێشان |
| الإخفاء | شاردنەوە |
| القلب | هەڵگەڕانەوە |
| إدْغَامٌ بغُنَّة | تێکهە ڵکێشانی بەمینگە |
| إدْغَامٌ بِلاغُنَّة | تێکهە ڵکێشانی بێ مینگە |
| الإدغام الشَّفَوِي | تێکهە ڵکێشانی لێوی |
| الإخفاء الشَّفَوِي | شاردنەوەی لێوی |
| الإظهار الشَّفَوِي | ئاشکراکردنی لێوی |
| المَدُّ الطَبِعي | درێژکردنەوەی سروشتی |
| مَدُّ البدل | درێژکردنەوەی گۆڕاو |
| مَدُّ العِوَض | درێژکردنەوەی لەبری |
| مَدُّ الصِّلَة | درێژکردنەوەی گەیاندن |
| المَدُّ المُتصِل | درێژکردنەوەی بەیەکگەیشتوو |
| المَدُّ المُنْفَصِل | درێژکردنەوەی جودا |
| المَدُّ العارض للسكون | درێژکردنەوەی تووش هاتوو بەهۆی زەنەوە (سکون) |
| مَدُّ اللِّين | درێژکردنەوەی ئاسان (نەرمی و نیانی) |
| القلقلة | هەژان: هەژانی دەنگی پیتەکەیە لەشوێنی دەرچونیەوە (مخرج) لەکاتی خوێندنەوەدا بەزەنەداری (ساكن) بە جۆرێك دەنگێکی بەرزی لێوە دەبیسترێ |
| القلقلةُ الكبرى | هەژانی گەورە |
| القلقلةُ الصُّغْرى | هەژانی بچووك |

# سەرچاوەکان


١- مصحف المدينة.

٢- تەفسیری ئاسان، برهان محمد أمین، بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ڕۆشنبیر.

٣- تقريب المنير للمبتدئ الصغير، ياسمين حسني نوبه، عبير حسن أبو علوش، خاليدة محمد الطوالية، الطبعة الأولى ١٤٣٨هـ - ٢٠١٧م.

٤- التجويد المصور، د.أيمن رشدي سويد، مكتبة ابن الجزري، الطبعة الأولى ١٤٣٢هـ - ٢٠١١م.

٥- الدُررُ البهية في التعريفات التجويدية، هشام عبدالباري محمد راجح، دار العالمية، الطبعة الأولى، ١٤٣١هـ - ٢٠١٠م.

٦- علم التجويد، د.يحيى عبدالرزاق الغوثاني، مكتبة دار الغوثاني، الطبعة الرابعة ١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤م.

٧- نزهة تجويدية، د.أيمن رشدي سويد، مكتبة دار الغوثاني، الطبعة الأولى ١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م.




# ناوەڕۆك

| بابـەت | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشەکی سەرۆکی دەزگا | ٦ |
| پێشەکی بەڕێز دلێر گەرمیانی | ٨ |
| پێشەکی نووسەر | ١٠ |
| وانەی یەکەم: پلە و پایەی قورئان خوێن | ١٢ |
| وانەی دووەم: ئادابەکانی قورئان خوێندن | ١٤ |
| وانەی سێیەم: چەند بنەمایەکی زانستی (تجوید) | ١٨ |
| بەڵگەکانی واجب بوونی جوان خوێندنەوە(تجوید) | ٢١ |
| وانەی چوارەم: خۆپەنادان و ناوی خودا هێنان | ٢٤ |
| وانەی پێنجەم: پیتەکانی پووك **(الأحرف اللثوية)** | ٢٦ |
| وانەی شەشەم: لامی ناساندن **(لام التعريف)** | ٢٩ |
| وانەی حەوتەم: نون و میمی شەددەدار **(النُّونُ وَالمِيمُ المُشَدَّدَتانِ)** | ٣٤ |
| مینگە (غنة) | ٣٥ |
| حوکمەکانی نونی زەنەدار و تەنوین **(أَحْكامُ النُّونِ السَّاكِنَةِ والتَّنوينِ)** | ٣٦ |
| وانەی هەشتەم: یەکەم: ئاشکراکردن (الإظهار) | ٣٧ |
| وانەی نۆیەم: دووەم: تێکهەڵکێشان (الإدغام) | ٤١ |

# ناوەڕۆك

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|




# ناوەڕۆك

| بـابـەت | لاپەڕە |
| --- | --- |





# سوپاس بۆ خودا ئاستی یەکەم
# تـەواو بــوو

جێگای خۆیەتی سوپاسی هەموو ئەو برا بەڕێزانە بکەین کە هاوکارمان بوون بەهەر شێوەیەك بە تایبەتی ئەوانەی لە کاتی نووسیندا یارمەتیاندایین.

داوا لە خودای بەخشندە و میهرەبان دەکەین کەوا پاداشتی چاکەیان بداتەوە لە ڕۆژێ کە هیچ شتێ بە هانای بەندەوە نایەت تەنها کردەوەکانی نەبێت.

اللهم آمين

﴿ سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ، وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلۡمُرۡسَلِينَ ، وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾



# بەرهەمەكانی نووسەر

## بەرهەمە چاپكراوەكان




تيسير الرحمن لە زانستی
جوان خوێندنەوەی قورئان
**قۆناغی یەكەم بۆ گەنجان**




تيسير الرحمن لە زانستی
جوان خوێندنەوەی قورئان
**قۆناغی دووەم بۆ گەنجان**




كانیاوی ڕەوان بۆ
فێربوونی پیتەكانی قورئان
**بۆ منداڵان**




كانیاوی ڕەوان بۆ فێربوونی
جوان خوێندنەوەی قورئان
**ئاستی یەكەم بۆ نەوجاوانان**

# بەرهەمەکانی نووسەر

## ئەم بەرهەمانەی لە ژێر چاپدان




کانیاوی ڕەوان بۆ فێربوونی
جوان خوێندنەوەی قورئان
**ئاستی دووەم بۆ نەوجاوانان**

کانیاوی ڕەوان بۆ فێربوونی
جوان خوێندنەوەی قورئان
**ئاستی سێیەم بۆ نەوجاوانان**



(**ابن القيم**) ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ دەفەرموێ:

ئەهلی قورئان ئەو کەسانەن کە زانان بە قورئان و کار بەناوەڕۆکی قورئان دەکەن، ئەگەر چی بە دەرخکردنەوە نەیخوێننەوە.

بـەڵام ئەو کەســەی دەرخی دەکات و تێـی نەگات و کار بە ناوەڕۆکی نەکات، ئەو کەســە ئەهلی قورئان نییە، ئەگەر چی وەکـو تیر پیتەکان بە ڕاســت و دروســتی لـە دەم دەربچێ و بخوێندرێتەوە.







